# هاوەڵان و

# خەلیفەکانی ڕاشیدین

# بناسە رضي الله عنهم

م . قاسم محمد

# هاوەڵان و خەلیفەکانی ڕاشیدین بناسە

رضي الله عنهم

ناوی نامیلکە: هاوەڵان و خەلیفەکانی ڕاشیدین بناسە ﷺ .

بابـــەت : ئایینی

نووسینی: م: قاسم محمد

چاپـی : یەکەم

ســـاڵی: ١٤٣٤هـ - ٢٠١٣م

تـیـــراژ : ٥٠٠٠ دانە

مۆبایـل : ٠٧٥٠٧٨٦٦٩٣٩

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ٧٦٥ ) ی ساڵی ( ٢٠١٣ ) ی پێدراوە.

Tenūs

لە چاپکراوەکانی **تێنووس**

بۆ چاپەمەنی و کارتۆگرافیك

00964 750 460 8374
E-mail: hoshyarmm@yahoo.co.uk

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

الحمد لله ربّ العالمين ، والصَّلاة والسَّلام على سيّد الأوّلين والآخرين سيّدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين .

موسوڵمانی بەڕێزو سەنگین :

بێگومان هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ نەك هەموویان بەڵکو هەر یەکەیان شایستەی ئەوەن چەندەها کتێبیان لەسەر بنووسرێ ، (سوپاس بۆ خوا ) زانایانی ئیسلام لەم بوارەدا کەمتەرخەمیان نەکردووە، بەلاَم زۆربەی موسوڵمانان کتێبی دوورو درێژ ناخوێننەوە. بۆیە بەپێویستم زانی نامیلکەیەکی زۆر کورت و پوخت بنووسم تاوەکو موسوڵمانان هەڵوێستی خۆیان بەرامبەر هاوسەرو هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ بزانن ، هەروەها دڵۆپێك لە دەریای ژیانی خەلیفەکانی ڕاشیدین شارەزابن . لەبەر ڕۆشنایی تیشکی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ و وتەی زانایانی ڕاستەقینەی ئیسلام ، تاوەکو نەکەونە ژێر کاریگەری ناحەزانی ئیسلام .

ئەمڕۆش لەم سەردەمەدا ( سوپاس بۆخوا ) موسوڵمانان وریا بوونەتەوە، بەتایبەتی چینی ڕۆشنبیران و گەنجان لەدەوری ئیسلامەکەیان

کۆبوونەتەوە و پوچەڵی و گەندەڵی بیرو بەرنامەی جگە لە خوایان بۆ دەرکەوتووە ، ئەمەش سەرەتایەکە بۆگەڕانەوەی حوکمی خوا لەسەر زەوی ، إن شاء الله تعالی .

لەکۆتایی داواکارم لەخوای تاك و تەنیا لەگەڵ خۆشەویستمان و نووری چاومان و گەورەمان (محمد) ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانی کۆمان بکاتەوە لەبەهەشتی پان و بەرین ، آمین .

**هەولێر**

**١ / شعبان / ١٤٣٤هـ**

**١٠ / ٦ / ٢٠١٣ م**

## ( باسی ئەصحابەکانی پێغەمبەر ﷺ )

### پێناسـەـ : ( صحابة ) ئەصحابە :

ئەو موسـولّمانەیە لە کاتی ئیسـلامەتی دا پێغەمبـەری ﷺ لە کاتی پێغەمبەرایەتی دا بەزیندوویی دیتبێ ، یان پێغەمبەر ﷺ ئەوی دیتبێ و بـە موسـولّمانەتیش مردبـێ ، جا ئادەمیزاد بـێ ، یان جنۆکە . ( فتح المبین ) ل ٢٠١ .

### ژمارەی ئەصحابەکان ﵃ :

کە پێغەمبـەر ﷺ وەفاتی کرد ، ژمارەی ئەصحابـەکان ( پیاوان و ئافرەتان ) ١٢٤,٠٠٠ سەدو بیست و چوار هەزار ئەصحابـە بـوو. ( نثر اللآلي ، للسید عبدالحمید الآلوسي ) ل ١٤٩ .

### ژمارەی ئەصحابەکانی فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە :

ئیمام ( ابـن الصلاح ) دەفەرمویّ : کە پێغەمبـەر ﷺ وەفاتی کرد ، ژمارەی ئەو ئەصحابـانەی کە گوێیان لە پێغەمبـەر ﷺ بـووەو فەرموودەیان لێ ڕیوایەت کردووە ( ١١٤,٠٠٠ ) سەدو چواردە هەزار ئەصحابە بووە. ( مقدمة علوم الحدیث ، لابن الصلاح ) ل ١٤٩ .

### پلەو پایەی ئەصحابەکان ﵃ لە قورئانی پیرۆزدا :

خوای گەورە لە قـورئانی پیرۆزدا لە زۆر شـوێن مەدحـی ئەصحابـەکانی پێغەمبەری ﷺ کردووە .

١- خـوای گـەورە دەفـەرمـوێ : ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ... ﴾ الفتح: ٢٩ ،

واتـە: ( محمد پێغەمبـەری خوایە، ئەو ئیماندارانەش کە لەگەڵیدان بەرامبەر بێ باوەڕان توندو تیژن و لە نێوان خۆیاندا بە بەزەیین، دەیان بینی لە ڕوکووع و سوجدە بردن دان ( واتە: بەزۆری خەریکی نوێژکردنن ) داوای فەزڵ و ڕەزامەندی خوا دەکەن، نیشـانەیان لەڕوخسـاریاندا دیارە بەهۆی زۆری سوجدە بردنیانەوە..) .

٢- خـوای گـەورە دەفـەرمـوێ ﴿ .. رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ... ﴾ التوبة: ١٠٠ ، واتە: ( خوا لەوان ڕازییە و ئەوانیش لە خوا ڕازین ) .

٣- خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ ...وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ... ﴾ الحدید:١٠، واتە: ( خودا بەڵێنی بەهەشتی بە هەموویان داوە ) .

مـوسـوڵمـانی خۆشەویسـت : لـەم چـەنـد ئـایـەتـە پـیرۆزانـەدا خـوای پەروەردگار گەورەترین مەدحـی هەموو ئەصحابـەکانی پێغەمبـەری ﷺ کردووە بەبێ جیاوازی .

**پلەو پایەی ئەصحابەکان لەچەند فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ :**

١- پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی : ( خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي... ) رواه البـخـاري و مسـلم، واتە : ( بـاشـترینی ئوممەتم ئـەم سـەدەیەی خـۆمـە... )، واتە :

ئەصحابەکان رضي الله عنهم .

٢-پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( أَكْرِمُوا أَصْحَابِي فَإِنَّهُمْ خِيَارُكُمْ ) حديث صحيح رواه أحمد و النسائي و الطبراني ، واتە : ڕێز لە ئەصحابەکانی من بنێن ، چونکە ئەوان باشترینی ئێوەن .

٣- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (...وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لِأُمَّتِي فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِي أَتَى أُمَّتِي مَا يُوعَدُونَ ) رواه مسلم ، واتە : ( ئەصحابەکانم نیشانەی ئەمن و ئاسایشن بۆ ئوممەتم ، کاتێ ئەصحابەکانم نەمان ئەو کاتە ئەو هەڕەشەیەی لە ئوممەتم کراوە دێتە دی ) ، واتە : شوێن هەوەس و ئارەزوو دەکەون .

موسوڵمانی بەڕێز: کاتێ تەماشای قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەکەین ، دەبینین لە دوای پێغەمبەران ئەصحابەکان رضي الله عنهم چاکترین و پاکترین کۆمەڵ و بەندەی خودا بوونە لەسەر زەوی .

## عەدالەتی ئەصحابەکان رضي الله عنهم :

ئیمامی ( النووی ) فەرموویەتی: زانایان هەموویان یەکدەنگن لەسەر عەدالەتی هەموو ئەصحابەکان رضي الله عنهم ( لەبەر ئەو مەدح و وەسفەیان لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ کراوە) . ( شرح صحيح مسلم ) ب١٥ ، ل١٤٥ .

## پلەو پایەی هاوەڵی کردنی پێغەمبەر ﷺ :

ئیمامی ( النووي ) فەرموویەتی :( وَفَضِيلَةُ الصُحْبَةِ وَلَوْ لَحْظَةً لا يُوا زِنُهَا عَمَلٌ وَلا تُنَالُ دَرَجَتُهَا بِشَيءٍ...) ( شرح صحيح مسلم ) ب١٦، ل٣١٠، واتە: ( پلەی هاوەڵی کردنی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ساتێکیش بێت ، هیچ کارو کردەوەیەك نایگاتێ ، وە ئەم پلەیەش بە هیچ شتێك بەدەست نایەت...) ،واتە: پلەی دیتنی پێغەمبەر ﷺ .

## هەڵوێستمان لە بەرامبەر ئەصحابەکانی پێغەمبەردا ﷺ :

ئیمامی ( الطحاوي ) لە کتێبی ( العقیدة الطحاویة ) فەرموویەتی :

( وَنُحِبُّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ ﷺ ) ئێمەی ( أهل السنة ) گشت ئەصحابەکانی پێغەمبەرمان خۆش دەوێت ، ( وَلا نُفرِطُ فِي حُبِّ أَحَدٍ مِنْهُمْ ) لە خۆشویستنی هیچ ئەصحابەیەك لە سنوور دەرناچین ( وَلا نَتَبَرَّأُ مِنْ أَحَدٍ مِنْهُمْ ) دژایەتی هیچ ئەصحابەیەك ناکەین ( وَنُبْغِضُ مَنْ يُبْغِضُهُمْ ) ئێمەی ( أهل السّنة ) ڕقمان لەو کەسەیە کە ڕقی لە ئەصحابەکان بێت ( وَبِغَيْرِ الْخَيْرِ يَذْكُرُهُمْ ) وە بە خراپە باسیان دەکا ( وَلا نَذْكُرُهُمْ إلاَّ بِخَيْرٍ ) باسی ئەصحابەکان ناکەین تەنها بە چاکە نەبێ ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( إِذَا ذُكِرَ أَصْحَابِي فَأَمْسِكُوا ) حدیث صحیح رواه النسائي و الطبراني ، واتە : کاتێ باسی ئەصحابەکانم کرا بە خراپە ، ئێوە دەمی خۆتان بگرن .

**ئیمامی ( النووی ) فەرموویەتی :**

ئەصحابەکان لەکاتی تەنگانەو پێویستی دا بۆ بونیاتنانی ئەم ئایینە پیرۆزە گیان و ماڵیان بەخشیوە، بەگیان و ماڵ (جهاد) یان کردووەو یارمەتی پێغەمبەریان ﷺ داوە، کەوابوو : جارێکی تر ئەم سەربەرزی یە بەدەست کەسی تر ناکەوێت . (شرح صحیح مسلم) ب ١٦، ل ٣١٠ .

**چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی جنێو دان و قسە گوتن بە ئەصحابەکان رضي الله عنهم :**

١- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( لا تَسُبُّوا أَحَداً مِنْ أَصْحابي... ) ، رواه مسلم ، واتە: ( ئێوە جنێو بە هیچ ئەصحابەیەکی من مەدەن.... ) .

٢ - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( اللّهَ اللّهَ في أَصْحابي لا تَتَّخِذوهُمْ غَرَضاً بَعْدِي... ) ، رواه أحمد و الترمذي و أبو نعيم في الحلية ، واتە : ( لە خوا بترسن ، لە خوا بترسن دەربارەی ئەصحابەکانی من ، لە دوای من مەیانکەنە تانەو تەشەرونەکەن قسەیان پێ بڵێن ) .

٣ - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( مَنْ سَبَّ أَصْحابي فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللّهِ وَالْمَلائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ) ، رواه أحمد والطبراني وأبو نعيم في الحلية وابن أبي عاصم في شرح السنة بسند صحيح ، واتە : ( هەر کەسێك جنێو بە ئەصحابەکانی من بدات ، لە عنەتی خودا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت ) .

موسوڵمانی بەڕێز : ئەگەر تەماشای ئەم فەرموودانە بکەین، دەبینین پێغەمبەر ﷺ لەعنەت و هەڕەشەی توندی کردووە لەو کەسانەی تانەو تەشەرو جنێو بە ئەصحابەکان دەدەن.

## حوکمی جنێودان و قسە گوتن بە ئەصحابەکان رضي الله عنهم :

زۆربەی زانایانی ئیسلام فەرموویانە : جنێودان بە ئەصحابەکان یەکێکە لە گوناهە گەورەکان، واتە: هەر کەسێك جنێو بە ئەصحابەکان بدات ئەو کەسە ( فاسق ) و گومڕایە. ( شرح صحيح مسلم ) ب١٦، ل ٣٠٩ و ( القام الحجر ) ل ١٠٦.

بەڵام لە فەرموودەیەکی مەزهەبی ئیمامی ( الشافعي ) دا هاتووە: هەر کەسێك جنێو بدات بە ئیمامی ( ابوبکر ) و ئیمامی ( عمر ) ( رضي اللّهُ عنهما ) کافر دەبێ. ( الصواعق المحرقة ) ل٣١٣ و ( اعانة الطالبين ) ب ٤ ، ل١٣٥ و ( القام الحجر ) ل ١٩٦ .

هەروەها فەرموودەی هەڵبژاردە لە ڕووی فەتواوە لە مەزهەبی ئیمامی ( الحنفی ) دا: هەر کەسێك جنێو بدات بە ئیمامی ( ابوبکر ) و ئیمامی ( عمر ) ( رضي اللّه عنهما ) کافر دەبێ. ( رد المحتار على الدر المختار ) ب ٦، ل ٣٧٦.

ئەمەی ڕابردوو دەربارەی ئیمامی ( ابوبکر ) و ئیمامی ( عمر ) بوو ( رضي اللّه عنهما )، چونکە لە فەرموودەیەکی مەزهەبی ئیمامی

( الشافعي ) دا هاتووە: هەر کەسێك جنێو بدات بە ئیمامی ( عثمان ) و ئیمامی ( علی ) ( رضي اللّه عنهما ) ئەویش کافر دەبێ . ( الصواعق المحرقة ) ل٣١٣ و ( اعانة الطالبين ) ب٤ ، ل١٣٥ و ( القام الحجر ) ل ٢٠٠ .

هەروەها لە بارەی ئەصحابەکانی تریش چەند زانایەکی ئیسلام فەرموویانە: هەر کەسێك جنێو بدات بە ئەصحابەکان و تانەو تەشەریان لێ بدات ، ئەویش کافر دەبێ .

لە کتێبی ( الخلفاء الراشدون ) د. مصطفى مراد لاپەڕە ( ٨٢١-٨٢٢ ) ناوی ئەو زانایانەو بەڵگەکانیانی هێناوەتەوە ، کە دەڵێن : هەر کەسێك جنێو بە ئەصحابەکان بدات ، یان ڕقی لە ئەصحابەکان ببێتەوە ئەوە کافر دەبێ .

## ( باسی هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ )

بزانە : هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ پێیان ئەگوترێ ( أُمَّهَاتُ الْمُؤمِنِينَ ) واتە: ( دایکانی ئیمانداران )، خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ﴾ الأحزاب : ٦، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە پێشترە بۆ ئیمانداران لە نەفسی خۆیان وە هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ دایکی ئیماندارانن ) .

بزانە: خێزانە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ پلەو پایەی تایبەتیان هەیە، لەلای خوای گەورەو هەم لەلای پێغەمبەر ﷺ وهەم لەلای بڕواداران.

١- خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾ الأحزاب:٣٣، واتە: ( بەڕاستی خوا دەیەوێ هەموو جۆرە پیسی و گوناهێك لە ئێوە دوور بخاتەوە ئەی ئال و بەیتی پێغەمبەر ﷺ ، وە پاك و خاوێنتان بكاتەوە بە تەواوی ) .

٢- خوای گەورە دەربارەی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾ الأحزاب: ٣٢ ، واتە : ( ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ ئێوە وەك هیچ كام لە ئافرەتانی تر نین ) ، واتە: پلەو پایەتان زۆر بەرزترە .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (... أُذَكِّرُكُمُ اللّهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي ثَلاثاً) رواه مسلم ، واتە: ( سێ جار فەرمووی ، خواتان بەبیردێنمەوە

دەربـــارەی خێزانەکانی من و کەس و کاری من ) ، ( واتە: لەخوا بترســـن ڕێزیان لێ بنێن و بێ ڕێزیان بەرامبەر مەکەن ) .

بزانە: ( أهل البيت ) واتە: خانەوادەو کەس و کاری پێغەمبـەر ﷺ . بـە بـەڵگەی قـورئانی پیرۆز لە سـورەتی ( الأحـزاب : ٣٣ ) ، کە پێشـتر تەفسیرمان کرد ، وە هەروەها بە فەرموودەی ( صحيح )ی پێغەمبەر ﷺ ، کە ئیمامی ( مسـلم ) ڕیوایەتی کردووە ، خێزانەکـانی پێغەمـبـەر ﷺ لە ( أهل البيت ) ن . ( تفسـير ابن كثير ) الأحـزاب : ٣٣ و ( شـرح صحـيح مسلم ) ، ب١٥، ل١٧٥ .

## حوکمی جنێودان و قسەگوتن بە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ :

١- حـوکمـی جنێودان وقسـەگوتن بـە دایکی ئیمانداران ( عائشـة ) رضي اللـه عنها:

بە ( إجماع ) واتە: یەکدەنگی زانایانی ئیسلام : هەر کەسێك تۆمەتی داوێن پیسی بداتە پاڵ دایکی ئیمانداران خاتوو ( عائشة ) ( رضي اللـه عنها ) ، یان گومانی لەداوێن پاکی ئەو هەبـێت ، ئەوە کافر دەبـێت و لە ئیسـلام دەچێـتە دەرەوە ، لەبەر ئـەوەی قورئـانی پـیرۆزی بەدرۆ خسـتۆتەوە ، چونکە خوای گەورە لە سورەتی ( النور ): ١١-٢٦ ، باسـی بـەڕائـەت و پـاکی دایـکمـان ( عائشـة ) ی ( رضي اللـه عنـها ) کردووە. ( تفسـير القرطبـي ) النور : ١٧و ( تفسير ابن كثير ) الـنور : ٢٣ و ( شـرح صحيـح

مسلم ) ب ١٧ ل ١١٦ .

ئیمامی ( السبـکی ) فەرموویەتی: خاتوو ( عائشـــة ) ( رضي اللّـه عنها ) خێزانی پێغەمبـەرە ﷺ، تۆمەت خستنە پاڵی مانای تۆمەت خستنە پاڵ پێغەمبەرو ﷺ شکاندنی ئابـڕووی پـێغەمبـەرە ﷺ ئەمـەش بۆ خـۆی کوفرە ( فتاوی السبکي ) ب ٢، ل ٥٩٢ .

٢- حوکمی جنێودان و قسەگوتن بە خێزانەکانی تری پێغەمبەر ﷺ :

ئیمام ( ابن کثیر ) لەبـــارەی تۆمەتی داوێن پیســی دانە پاڵ خێزانەکانی تری پێغەمبـــەر ﷺ دەفەرموێ : ڕاســـترینیان ئەمەیە: هەر کەســێك تۆمەتی داوێن پیســی بـــداتە پاڵ خێزانەکانی تری پێغەمبـــەر ﷺ کافر دەبـێت ، هەروەها ( ابـن عبـــاس ) ( رضي اللّـه عنهما ) دەفەرموێ : ئەم جۆرە جنێودانە ئازاردانی زۆری پێغەمبـــــەری ﷺ تێدایە و هەم تانەو تەشەردانە لە ئابڕووی پێـغەمبـەر ﷺ . ( تفسـیر ابن کثیر ) النـور: ٢٣ و ( الخلفاء الراشدون ) د. مصطفی مراد ، ل٨١٧ .

## باسی ( الْعَشَرَةُ الْمُبَشَّرَةُ )

**العَشَرَةُ المُبَشَّرَةُ : دە ئەصحابەکانی موژدە پێدراو بە بەهەشت :**

ئەو دە ئەصحابەن کە هەر لە دونیادا پێغەمبەر ﷺ ناوی هێناون و موژدەی بەهەشتی پێداون و فەرموویەتی : ( عَشَرَةٌ فـي الْجَنَّةِ: أَبو بَكْرٍ فـي الْجَنَّـةِ ، وعُمَرُ في الْجَنَّةِ ، وعُثمَانُ فـي الْجَنَّةِ ، وعَليٌّ في الْجَنَّةِ ... إِلى آخِرِ الْعَشَرَةِ ) ، رواه الترمذي وأبو داود بسند صحيح ، واتە: ئەو دە کەسانە دەچنە بەهەشت کە ئەم بەڕێزانەن : ( أَبو بَكْر ، عُمَر ، عُثمان ، عَلي ، طَلْحَة ، الزُّبَير ، سَعْدُ بنُ أَبي وَقَّاص ، سَعيدُ بنُ زَيد ، عَبدُ الرحمنِ بنُ عَوف ، أَبُو عُبَيدَةَ بنُ الْجَرّاح ) رضي الله عنهم .

ئینجا بزانە: هەموو ئەصحابەکانی پێغەمبەر ﷺ بەهەشتین ، بەڵام لەم فەرموودەیە تەنها ناوی دە ئەصحابەی هێناوە ، تاکو بزاندرێ ئەمانە ڕێزی تایبەتیان هەیەو پلەو پایەیان بەرزترە، ( التاج الجامع للأصول ) ب ٣ ، ل ٣٤٥.

**ڕێزی گەورەیی هاوەڵان رضي الله عنهم :**

بزانە: هەر چوار خەلیفەکانی ڕاشیدین لە هەموو ئەصحابەکان گەورەترن - یەك لە دوای یەك - بە گوێرەی ڕێزی ( خلافة ) ، واتە :

١- ئیمامی ( أبوبکر ) ٢- ئیمامی ( عمر ) ٣- ئیمامی ( عثمان ) ٤- ئیمامی ( علي ) ، ئینجا شەش موژدە پێدراوەکەی تر کە باسمان

کردن ، ئینجا ئامادەبوانی ( بَيْعَةُ الرِّضْوان ) ، واتە: پەیمانی لێ ڕازی بوون، کە ( ١٤٠٠ ) هەزارو چوار سەد ئەصحابە لە ژێر درەختەکەی ( الحديبية ) پەیمانیان دا بە پێغەمبەر ﷺ لەسەر جەنگ کردن تا شەهید بوون ، یان سەرکەوتن . ( شرح صحيح مسلم ) ب ١٥، ل ١٤٤.

## وتەی زانایانی ئیسلام لەبارەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ :

١- خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز لە کۆتایی ( سورة الفتح ) ، وەسف و مەدحی ئەصحابەکانی پێغەمبەر ﷺ دەکات و لەپاشان دەفەرموێ ﴿ ...لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ﴾ الفتح: ٢٩ ،واتە: ( ئەم وەسف و مەدحە بۆ ئەوەیە ڕق و تووڕەیی کافرەکانی پێ هەڵبستێنێ ) ، ئیمامی ( مالك ) لەم ئایەتە وەری گرتووەو کردویەتیە بەڵگەو دەفەرموێ : هەر کەسێك ڕقی لە ئەصحابەکان ببێتەوە ، بەبەڵگەی ئەم ئایەتە کافرە . ( تفسیر ابن کثیر ) سورة الفتح :٢٩ وە ئیمام ( ابن الحجر الهيتمي ) فەرموویەتی: ئەمە وەرگرتنێکی جوانە ئایەتەکەش شاهیدی بۆ دەدەن، وە ئیمامی ( الشافعي ) ش هەمان ڕاو بۆچوونی هەیە، لەگەڵ کۆمەڵێك لەزانایان ( الصواعق المحرقة ) ل ٢٥٩.

٢- ئیمامی ( الطحاوي ) لە کتێبی ( العقيدة الطحاوية ) فەرموویەتی :
( حُبُّهُمْ دِينٌ وَإِيمانٌ وَإِحْسَانٌ ) خۆشویستنی ئەصحابەکان نیشانەی دین و ئیمان و چاکەیە ( وَبُغْضُهُمْ كُفْرٌ وَنِفاقٌ وَطُغْيانٌ ) ڕق لێبوونەوەی ئەصحابەکان نیشانەی کوفرو دووڕوویی و لە سنوور دەرچوونە .

٣- ئیمام ( ابـو زرعة الرازي ) كە مامۆسـتای ئیمامی ( مسـلم ) بـووە، فەرموویەتی :

ئەگەر بینیت كەسێك لە پلەو پایەی ئەصحابـەكانی پێغەمبـەری ﷺ كەم دەكردەوەو تانەو تەشـەری لێ دەدان بـزانە ئەوە زەندیقـە واتە: ( بـێ دین )ـە ، چونكە پێغەمبەر ﷺ لای ئێمە حەقە و قورئانیش حەقە ، دیارە قورئان و فەرموودەش لە ڕێگەی ئەصحابەكانەوە گەیشتۆتە ئێمە، لەبـەر ئـەوە هەر كەسـێك تانەو تەشـەریان لێ بـدات ئـەوا دەیـەوێ ( قـورئان و سوننەت ) پوچەڵ بكاتەوە ، بۆیە بـریندار كردنی سـومعەی ئەصحابـەكان پیشەی زەندیقەكانە ( الصواعق المحرقة ) ل ٢٦٠ .

٤- ئیمام ( ابن حجر الهيتمي ) فەرموویەتی:

خـوای گـەورە دەفـەرموێ ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴾ آل عمران : ١١٠ ، واتە: ( ئێوە (موسوڵمانان) باشـترین ئوممەتێكن كە بـۆ مرۆڤایەتی پەیداكراون ) .

بـزانە: خوای گەورە شـاهێدی داوە كە ئوممەتی پێغەمبـەر ﷺ باشـترین ئوممەتە، هەروەها بە پلەی یەكەم ئەم شاهێدیە ئەصحابـەكانی پێغەمبـەر ﷺ دەگرێتەوە، چونكە پێغەمبـەر ﷺ شـاهێدی داوە بـۆیان و فەرموویەتی : (خَيْرُ أُمَّتِي الْقَرْنُ الَّذِي بُعِثْتُ فِيهِمْ...) رواە مسـلم ، واتـە: ( باشـترینی ئوممەتم ئەوانەی ئەو سـەدەیەن كە من لە ناویاندا نێردراوم ) .

ئینجا لە پاش شـــــاهێدی دانی خوای پەروەردگار هەر کەســـــێك ئەصحابەکان ﵃ بە باش نەزانێ و بەخراپە باسیان بکات ، ئەوە قسـەی خوای گەورەی بــە ڕاســـت نەزانیوە، هەر کەســـێکیش قســـەی خواو پێغـەمبـەر ﷺ بەڕاســـت نەزانێ ئەوە بـە یـەکدەنگی زانـایـان کـافرە . ( الصواعق المحرقة ) ٢٥٧ و ٢٥٨.

## موسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست :

بەڕاستی چاکی و پاکی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبـەر ﷺ بەتایبـەتی هەر چوار خەلیفەکانی ڕاشیدین بەڵگەی سەرکەوتوویی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە پەروەردەکردن و پێگەیاندنی هاوەڵە بەڕێزەکانی دا ، بە پێچەوانەوەش بە پێچەوانەوەیە ، بۆیە تانەو تەشەر دان لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبـەر ﷺ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ تانەو تەشەر دانیشـە لە پێغەمبـەر ﷺ کە لە بانگەوازەکەی سەرکەوتوو نەبووە .

## خەلیفەی یەکەم ( أبُـو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ ) رضي الله عنه

١- نـاوی ( عـبـدالله ) ی کوڕی ( عـثـمـان ) ی کـوڕی ( عـامـر ) ی قوڕەیشـی یە ، دوو سـاڵ و چەند مانگێك لە دوای ڕووداوی ( عام الفيل ) لە شـاری مەککە لەدایك بـووە ، نـازنـاوی ( الصديق ) ـە ، واتـە: ڕاسـتگۆ ، ناسـراو بە ( أبوبكر ) رضي الله عنه باوکی نـاسـراوبـوو بـە ( أبـو قُحـافَة ) ، نـاوی دایکی ( سلمـى ) یە .

٢- یەکێك بـووە لە ( العشـرة المبشـرة ) لەو دە کەسـەی هەر لە دونیادا پێغەمبەر ﷺ موژدەی بەهەشـتی پێداون و فەرموویـەتی: ( أَبُـو بَكْرٍ فـي الْجَـنَّةِ ) رواه الترمذي و أبـو داود بسـند صحـيح ، واتە: ( ابوبـكر دەچێتە بەهەشـــت ) . هەروەها هەندێك ئەصحابە لەسـەر دەستی ئەو موسوڵمان بوون ، وەك :( عـثـمـان بن عـفـان ، عـبدالرحمن بـن عـوف ، سـعد بـن أبـي وقاص ، الزبير بن العوام ، طلحة بن عبيداللّـه )...هتد رضي الله عنهم .

٣- تاکە ئەصحابـەیە کە خۆی و بـاوکی و دایکی و هەموو کوڕو کچەکانی موسوڵمان بوون . هەروەها خەزووری پێغەمبەر ﷺ بووە ، چونکە خاتوو ( عائشــة ) ی کچی ( رضي اللّـه عنها ) خێزانی پێغەمبـەر ﷺ بـــووە. هەروەهـا لەچـەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بە مەدحـی ئیمامی ( أبوبـــكر ) رضي الله عنه کراوە ، وە لەهەموو غەزایەکان بەشــــداری کردووە و خۆڕاگر بووە .

٤- زۆر ئەشکەنجە و ئازاری چەشتووە بەدەستی کافرەکان وەهەموو ماڵ و سامانی خۆی بەخت کردووە لە پێناوی پاراستن و بەرزکردنەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام . پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( إِنَّ أَمَنَّ النَّاسِ عَلَيَّ فِي صُحْبَتِهِ وَمَالِهِ أَبُوبَكْرٍ... ) رواه البخاري ، واتە : ( تاکە کەسێك کە زۆر بەخشندەو چاك بووبێ لەگەڵمدا لە هاوڕێیەتی و لە ماڵی دا ( ابوبکر )ە) رضي الله عنه .

٥- چوار خێزانی هەبوو بە درێژایی تەمەنی : ( قتیلة ، ام رومان ، أسماء ، حبيبة ) .

٦- سێ کوڕی هەبوو : ( عبدالرحمن ، عبدالله ، محمد ) .

٧- سێ کچی هەبوو : ( أسماء ، عائشة ، أم کلثوم ) .

٨- ئەصحابەکانی پێغەمبەر ﷺ هەموویان یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە ئیمامی ( ابوبکر ) لەهەموو کەس شیاو ترو لەپێشترە بۆ خەلیفایەتی لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ .

٩- هەندێك لە تایبەتمەندیەکانی ئیمامی ( ابوبکر ) رضي الله عنه :

أ- یەکەم کەس بووە لە پیاوان موسوڵمان بووە .

ب- لەژیانی دا سوجدەی بۆ بت نەبردووە .

جـ- هاوڕێی پێغەمبەر ﷺ بووە لە ( هجرة ) و لە ئەشکەوتی ( ثَوْر ) .

د- بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی بۆ موسوڵمانان کردووەو

پێغەمبەریش ﷺ نوێژی لەدوادا کردووە .

هـ- بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ هەرچی دەرگا هەیە کە بۆ هاتوچۆی نوێژ لەمزگەوتدا کرابوونەوە هەمووی داخران جگە لە دەرگای ئیمامی (ابوبکر) ﵁ .

و- خۆڕاگر بووە لەکاتی وەفاتی پێغەمبەر ﷺ .

ز- جەنگی دژی هەڵگەڕاوەکان و زەکات نەدەرەکان کردو فەرمووی: چۆن دەبێ دینی ئیسلام کزو لاواز بێ منیش زیندوو بم .

ح- قورئانی کۆکردەوە .

ط- لەهەموو ئەصحابەکان ﵃ زاناتر بووە لە قورئان و سوننەت .

ی- بەڕەحم ترین کەس بووە ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( أَرْحَمُ أُمَّتِي بِأُمَّتِي أَبُو بَكْرٍ.. ) رواه أحمد و الترمذي و ابن ماجه ، واته: ( بەڕەحمترین کەس لەناو ئوممەتەکەمدا بۆ ئوممەتم ( ابوبکر ) ە ).

١٠- ماوەی فەرمانڕەوایی (٢) ساڵ و (٣) مانگ و (١٠) ڕۆژ بووە ، لە تەمەنی (٦٣) ساڵی دا ، لە ساڵی (١٣) ی کۆچی وەفاتی کرد و لە تەنیشت پێغەمبەر ﷺ نێژرا .

**هەندێك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر گەورەیی و ڕێزداری ئیمامی ( ابوبکر ) ﵁ :**

١- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ

الْمَهْدِيِّينَ مِنْ بَعْدِي ) رواه ابو داود والترمذي بسند صحيح ، واته : ( ئێوە شوێن ڕێبازی من و ڕێبازی هەر چوار خەلیفەکانی دوای من بکەون کە لەسەر ڕێگای ڕاستن و شارەزای ئایینی ئیسلامن ) .

٢ - ( عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: عَائِشَةُ ، فَقُلْتُ: مِنَ الرِّجَالِ؟ قَالَ: أَبُوهَا قُلْتُ : ثُمَّ مَنْ ؟ قَالَ :ثُمَّ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ ) رواه البخاري ومسلم ، واته : ( عەمر رضي الله عنه پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد خۆشەویسترین کەس لەلای تۆ کێ یە؟ فەرمووی ( عائشة ) ، وتم لە پیاوان؟ فەرمووی باوکی ، واتە ( ابوبکر )، وتم لە پاشان کێ؟ فەرمووی : لە پاشان ( عمر ) ی کوڕی ( الخطّاب ) .

٣- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( مَا لِأَحَدٍ عِنْدَنا يَدٌ إِلَّا وَقَدْ كَافَأْنَاهُ مَا خَلا أَبَا بَكْرٍ فَإِنَّ لَهُ عِنْدَنا يَدًا يُكَافِئُهُ اللَّهُ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ ) رواه أحمد والترمذي بسند حسن، واته : ( هەر کەسێك چاکەی لەگەڵ کردبین ئێمە پاداشتمان داوەتەوە تەنها ( ابوبکر ) نەبێ ، چاکەی وای لەگەڵمان کردووە هەر خودا بەخۆی لە ڕۆژی دواییدا پاداشتی ئەو چاکەیەی دەداتەوە ) .

٤ – پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( إِنَّ اللَّهَ بَعَثَنِي إِلَيْكُمْ ، فَقُلْتُمْ: كَذَبْتَ ، وَقَالَ أَبُوبَكْرٍ: صَدَقَ ، وَوَاسَانِي بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ ، فَهَلْ أَنتُمْ تَارِكُو لِي صَاحِبِي ؟ ) مَرَّتَيْنِ فَمَا أُوذِيَ بَعْدَهَا . رواه البخاري ، واته : ( بێگومان

خوای گەورە منی کرد بە پێغەمبەر و ڕەوانەی کردم بۆ لاتان ، ئێوە وتتان درۆ دەکەی ، ئەبو بەکر وتی : ڕاست دەکات ، بەسەر و ماڵی خۆی دڵنەوایی و پشتگیری کردم ، ئینجا دووجار فەرمووی : ئایا ئێوە واز لە ئازاردانی ئەم هاوڕێیەم ناهێنن لەبەر خاتری من؟ ) پاش ئەمە هەرگیز ئیمامی ( ابوبکر ) رضي الله عنه ئازار نەدراوە ، چونکە هاوەڵان تێگەیشتن هیچ کەس هاوشانی ئەو نیە ) .

٥- ئیمامی ( ابوبکر ) رضي الله عنه لەهەموو دەرگاکانی بەهەشت بانگ دەکرێت . ڕۆژێکیان ئیمامی ( ابوبکر ) رضي الله عنه فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەس هەیە لەهەموو دەرگاکانی بەهەشت بانگ بکرێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ( نَعَمْ ، وَأَرجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُم يا أَبَابَكْرٍ ) رواه البخاري ، واتە : ( بەڵێ ، هیوام وایە تۆ یەکێك بیت لەوانە ئەی ئەبوبەکر ) .

٦- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( أَنتَ صاحِبِي عَلَى الْحَوْضِ، وَصاحِبِي فِي الْغارِ ) رواه أحمد و الطبراني و الحاكم و الترمذي بسند صحيح ، واتە : ( تۆ ( ئەی ئەبو بەکر ) هاوڕێی منی لەسەر حەوزی کەوسەر ، هەروەك هاوڕێم بووی لە ئەشکەوتی ( ثَوْر )) .

٧- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( إنَّكَ يَا أَبَا بَكْرٍ أَوَّلُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي ) رواه أبو داود وأحمد والحاكم وصححه ، واتە : ( بەڕاستی تۆ ئەی ( أبوبکر ) یەکەم کەسی لە ئوممەتم دەچیتە بەهەشت ) .

ئیمام ( ابن حجر الهیتمي ) لە کتێبی ( الصواعق المحرقة ) زیاتر لە ( ١٠٠ ) سەد فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ هێناوەتەوە لەسەر گەورەیی و ڕێزداری ئیمامی ( أبوبکر ) رضي الله عنه .

ئینجا بزانە: ئیمامی ( النووی ) دەفەرموێ : ( أهل السنة ) یەکدەنگن کە ئیمامی ( ابوبکر ) لەهەموو ئەصحابەکان گەورەترە. ( شرح صحیح مسلم ) ب ١٥، ل ١٤٤.

## خەلیفەی دووەم ( عُمَرُ بْنُ الْخَطّابِ ) رضي الله عنه

١- ناوی ( عمر ) ی كوڕی ( الخطّاب ) ی قوڕەیشی یە ، (١٣) ساڵ پاش ڕووداوی ( عام الفيل ) لە شاری مەككە لە دایك بووە ، ناوی دایكی ( حَنْتَمَة ) یە نازناوی ( الفاروق ) ـە ، واتە: جیاكەرەوە لەنێوان حەق و ناحەق ، ناسراو بە ( أبُوحَفْص ) .

٢- یەكێك بووە لە ( العشرة المبشرة ) لەو دە كەسەی هەر لە دونیادا پێغەمبەر ﷺ موژدەی بەهەشتی پێداون و فەرموویەتی ( عُمَرُ فِي الْجَنَّةِ ) رواه الترمذي وأبو داود بسند صحيح ، واتە: ( عومەر ) دەچێتە بەهەشت. هەروەها ئەصحابەكان رضي الله عنهم هەموویان یەكدەنگ بوون لەسەر ئەوەی كە ئیمامی ( عمر ) رضي الله عنه لە هەموو كەس شیاوترو لەپێشترە بۆ خەلیفایەتی لەدوای ئیمامی ( ابوبكر ) رضي الله عنه .

٣- لەدوای ئیمامی ( ابوبكر ) رضي الله عنه لە هەموو ئەصحابەكان خۆشەویستتر بووە لای پێغەمبەر ﷺ ، هەروەها خەزووری پێغەمبەر ﷺ بووە ، چونكە ( حفصة ) ی كچی ( رضي اللّه عنها ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ بووە .

٤- مرۆڤێكی ئازا و دانا و تێگەیشتوو بوو، تەنانەت لە سەردەمی پێش ئیسلامەتیشدا دادوەری لە نێوان عەرەبەكاندا دەكرد لەگێرەوكێشەكاندا هەروەها لەسەردەمی ئیسلامەتی دا خاوەن بڕیار بوو، لەهەموو غەزایەكاندا بەشداری كردووەو خۆڕاگر بووە .

٥- حەوت خێزانی هەبووە بە درێژایی تەمەنی : (زینب ، ملیكة ، قُرَیبة ، ام حكیم ، جمیلة ، عاتكة ، أم كلثوم) .

٦- نۆ كوڕی هەبوو: ( (زید)ی گەورە ، (زید)ی بچووك ، عاصم ، عبدالله ، (عبدالرحمن) ـی گەورە ، (عبدالرحمن) ـی ناوەنجی ، (عبدالرحمن) ـی بچووك ، عبیدالله ، عیاض) .

چوار كچی هەبوو: ( حفصة ، رقیة ، زینب ، فاطمة ) .

٧- هەندێك لە وتە بەنرخەكانی ئیمامی ( عمر ) رضي الله عنه :

أ- خۆتان لە ( شەریعەتی ئیسلام ) شارەزا بكەن پێش ئەوەی بكرێنە گەورە ، چونكە هەر كەسێك ( شەرع ) بزانێ و گەلەكەی خۆی بیكاتە گەورە ، دەبێتە هۆی ژیانێكی خۆش بۆخۆیی و بۆ ئەوان .

ب- ئێمە لەپێش ئیسلام گەلێكی زەلیل و بێ ڕێز بوین ، خوای گەورە بەهۆی ئایینی پیرۆزی ئیسلام گەورەو ڕێزداری كردین ، ئەگەر بمانەوێ بەجگە لەئیسلام سەربەرز بین ، ئەوا خوای گەورە زەلیل و سەر شۆڕمان دەكات .

جـ- چۆن ئێوە ئەم خەڵكەتان كردۆتە كۆیلەی خۆتان ، لەكاتێكدا ئەوان بە ئازادی لەدایك بوون .

د- خوای گەورە بۆ هەر كارێك دەرگایەكی ڕەحمەتی لە بەندەكانی خۆی كردۆتەوە ، بۆئەو دەرگایەش كلیلێكی داناوە .

هـ- لەهەمووکەس نەزانتر ئەو کەسەیە لەبەر ڕەزامەندی خەڵك واز لە ڕەزامەندی خوا بێنێت .

و- باشترین هۆکاری ڕزگاری مرۆڤ لە ڕۆژی قیامەتدا سەبرو خۆڕاگریە لەسەر ڕووداوەکان .

ز- مرۆڤی ئاقڵ وژیر ئەو کەسەیە کەڕۆژی ڕابردووی خۆی بکاتە وانەو پەندی ئەمڕۆی .

ح- لەهەمووکەس ئاقڵ و ژیرتر ئەوکەسەیە کە عوزرو بیانووی خەڵکی قەبووڵ بکات .

ط- ئێش و ژانی زمانی مرۆڤ بەئێشترە لە ئێش و ئازاری سەری تیرەکان .

ی- تەنیایی باشترە لە هاوڕێیەتی کردنی هاوەڵی خراپ .

٨- هەندێك لە تایبەتمەندیەکانی ئیمامی ( عمر ) رضي الله عنه :

أ- زیاترلە بیست شوێن لە قورئاندا لەسەر بۆچوونی ئیمامی ( عمر ) رضي الله عنه ئایەت دابەزیوە .

ب- دەرگایەك بوو لەپێش ئاژاوەو فیتنە ، واتە: هەتا ئیمامی ( عمر ) رضي الله عنه مابوو هیچ کەس نەیدەوێرا ئاژاوە بنێتەوە .

ج- شەیتان لە ئیمامی ( عمر ) رضي الله عنه دەترسا ، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ( إِنَّ الشَّيطَانَ لَيَخَافُ مِنْكَ يَا عُمَرُ ) رواه الترمذي بسند

صحيح ، واتە: ( بەڕاستی شەیتان لەتۆ دەترسێ ئەی عومەر ) .

د- زۆر توندبوو لەسەر حەق و ڕاستی و دینی خودا ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( أَشَدُّهُمْ فِي دِينِ اللَّهِ عُمَرُ ) رواه أحمد والترمذي وابن ماجه ، واتە: ( توندترینی ئوممەتم لەسەر دینی خودا عومەرە ) .

هـ- لەکاتی ( هجرة ) دا بەئاشکرا کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە .

و- پێغەمبەر ﷺ دوعای شەهیدی بۆکردووەو فەرموویەتی (... وَمُتْ شَهِيداً ) رواه أحمد وابن حبان ، واتە: بمرە بە شەهیدی . ( لە دواییدا شەهیدیش بوو ) .

٩- لەسەردەمی ئیمامی ( عمر ) رضي الله عنه دەوڵەتی ئیسلامی زۆر پەرەی سەندو ڕووبەرێکی فراوانی گرتەوە لە ڕزگارکردنی وڵاتان ، لە شام و میصر و لیبیا و عێراق و ڕۆژهەلات . ڕووداوی زۆر گرنگ لە خەلافەتی ئیمامی ( عمر ) رضي الله عنه ڕوویانداوە ، وەك ١- جەنگی ( القادسية ) لە ساڵی ( ١٤ ) ی کۆچی . ٢- فەتح کردنی (بيت المقدس) لە ساڵی (١٦) ی کۆچی . ٣- جەنگی ( نهاوند) لە ساڵی ( ٢١ ) ی کۆچی . هتد...

١٠- ماوەی فەرمانڕەوایی ( ١٠ ) ساڵ و (٦) مانگ و (٤) ڕۆژ بوو ، لە تەمەنی (٦٣) ساڵی دا بەدەستی ( أَبُو لُؤْلُؤَة ) ی ئاگرپەرست لەساڵی (٢٣) ی کۆچی شەهید کرا ، لەتەنیشت پێغەمبەر ﷺ و ئیمامی ( ابوبكر ) رضي الله عنه نێژرا .

**هەندێك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر گەورەیی و ڕێزداری ئیمامی ( عُمَر ) رضي الله عنه :**

١ - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( لَقَدْ كَانَ فِيمَا قَبْلَكُمْ مِنَ الأُمَمِ مُحَدَّثُونَ ، فَإِن يَكُ فِي أُمَّتِي أَحَدٌ فَإِنَّهُ عُمَرُ ) رواه البخاري ومسلم ، واتە: ( بێگومان لە ئوممەتەکانی پێش ئێوەدا خەڵكانێك هەبوون ئیلهامیان پێدرابوو حەق و ڕاستی خرابووە سەر زمانیان ، جا ئەگەر لە ئوممەتی من یەكێك هەبێ ئەوە عومەرە ) .

٢ - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( إقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعدِي أبي بَكرٍ وَعُمَرَ ) رواه أحمد والحاكم وصححه الطبراني وابن ماجه والترمذي وحسنه ، واتە: ( ئێوە شوێن هەردوو جێنشینەکەی دوای من بکەون کە ئەبوبەکرو عومەرن ) .

٣ - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( إنَّ اللَّهَ جَعَلَ الْحَقَّ عَلَى لِسَانِ عُمَرَ وَقَلْبِهِ ) رواه أحمد وابن حبّان و الحاكم وأبو داود والترمذي بسند حسن صحيح ، واتە: ( بەڕاستی خوای گەورە ڕاستی داناوەتە سەر دڵ و زمانی عومەر ) .

٤ - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( لَوْ كَانَ بَعْدِي نَبِيٌّ لَكَانَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ) رواه أحمد والحاكم والطبراني والترمذي بسند حسن ، واتە: ( ئەگەر لەدوای من پێغەمبەرێك هەبوایە ئەوە عومەر

دەبوو بە پێغەمبەر ) .

٥- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( أَبُوبَكرٍ وَعُمَرُ سَيِّدَا كُهُولِ أَهْلِ الْجَنَّةِ مِنَ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ إلّا النَّبِيِّينَ وَالْمُرْسَلِينَ ) رواه أحمد وابن ماجه والحاكم والترمذي بسند حسن ، واتە: ( ئەبوبەكر و عومەر گەورەو سەرداری جوامێرەكانی ئەهلی بەهەشتن لەسەرەتاوە تا كۆتایی خەڵك جگە لە پێغەمبەران ) .

## خەلیفەی سێیەم ( عُثمانُ بْنُ عَفّانٍ ) رضي الله عنه

١- ناوی ( عثمان ) ی کوڕی ( عَفّان ) ی قوڕەیشی یە ، ( ٦ ) ساڵ پاش ڕووداوی ( عام الفیل ) لەشاری مەککە لەدایك بووە ، ناسراو بە ( أبو عبدالله ) ، ناوی دایکی ( أروى ) یە ، ناوی داپیری ( ام حکیم ) ـە ، کە دەکاتە پلکی پێغەمبەر ﷺ .

٢- نازناوی ( ذو النّورین )ە ، واتە: خاوەن دوو نوور ، چونکە ( رقیة ) ی کچی پێغەمبەر ﷺ خێزانی بوو ، کە وەفاتی کرد ( ام کلثوم ) ی لێ مارەکرد ، کە ئەویش وەفاتی کرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەگەر کچی سێیەمم هەبوایە لێم مارە دەکرد ، وە فەرمووی بەفەرمانی خودا ئەم کچانەم لێ مارە کردووە .

٣- یەکێکە لە ( العشرة المبشرة ) لەو دەکەسەی کە هەر لەدونیادا پێغەمبەر ﷺ موژدەی بەهەشتی پێداون و فەرموویەتی: ( عُثمَانُ فِي الْجَنَّةِ ) رواه الترمذي وأبو داود بسند صحیح ، واتە: ( عثمان ) رضي الله عنه دەچێتە بەهەشت . هەروەها ئەصحابەکان رضي الله عنهم هەموویان یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە ئیمامی ( عثمان ) رضي الله عنه لە هەموو کەس شیاوترو لەپێشترە بۆ خەلیفایەتی لەدوای ئیمامی ( عمر ) رضي الله عنه .

٤- لەهەموو غەزایەکاندا بەشداری کردووە جگە لە غەزای ( بدر ) بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ ماوە لەبەر ئەوەی ( رقیة )ی خێزانی نەخۆش بوو ،

هەروەها لە غەزای ( ذات الرقاع و غطفان ) بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بە سەرپەرشتکاری مایەوە لە مەدینە .

٥ - هەشت خێزانی هەبووە بەدرێژایی تەمەنی: ( رقیة ، ام کلثوم ، فاختة ، ام عمرو ، فاطمة ، ام البنین ، رملة ، نائلة ) .

٦ - دە کوڕی هەبوو: ( عبدالله ، ( عبدالله ) ی بچووك ، خالد ، أبان ، عَمرو ، الولید ، سعید ، عبدالملك ، عُمر ، عنبسه ).

٧ - حەوت کچی هەبوو: ( مریم ، ام سعید ، عائشه ، ام ابان ، ام عَمرو ، (مریم) ی دووەم ، ام البنین )

٨- هەندێك لە تایبەتمەندیەکانی ئیمامی ( عثمان ) ﵁ :

أ- لەژیانی دا سوجدەی بۆ بت نەبردووە .

ب- جگە لەئیمامی ( عثمان ) ﵁ هیچ کەسێك نیە دوو کچی پێغەمبەرێکی هێنابێ، لە زەمانی حەزرەتی ( آدم ) ﷺ تا کۆتایی دونیا .

جـ- دوو جار ( هجرة ) ی کردووە ، یەکەم جار بۆ ( حبشة ) ، دووەم جار بۆ ( مدینة ) ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ( عثمان ) ﵁ یەکەم کەسە بەخاو خێزانی کۆچی کرد بۆ ( حبشة ) .

د- قورئانی کۆکردەوە ( لەسەر یەك شێوە خوێندن ) .

هـ- هەردوو مزگەوتی گەورەکرد ( ماڵی خودا ( المسجد الحرام ) و مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ ) .

و- زۆر بەشەرم و حەیا بووە ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( أَصْدَقُهُمْ حَيَاءً عُثْمَانُ ) رواه أحمد والترمذي وابن ماجه ، واتە: ( بەشەرم و حەیاترینی ئوممەتم ( عثمان ) ـە ) رضي الله عنه.

ز- هەموو حەفتەیەك بەندەیەكی ئازاد دەكرد .

٩- زۆرترینی ڕزگارکردنی ولآتان لەسەردەمی ئیمامی ( عثمان ) رضي الله عنه بوو لەهەموو لایەك ڕزگارکردنی ولآتان دەستی پێکرد ، هەروەها یەكەم جاربوو ڕێگەی دا جەنگی دەریایی بكرێ .

١٠- ماوەی فەرمانڕەوایی (١٢) ساڵ (١٢) ڕۆژی کەم بوو ، لەتەمەنی (٨٢) ساڵی دا ، لە ساڵی (٣٥) ی کۆچی لەماڵی خۆی کە بەڕۆژوو بوو ، لەکاتی قورئان خوێندن بەدەستی چەند کەسێکی ئاژاوەچی بەستەم لێکراوی شەهید کراو لە ( بقیع ) نێژرا .

## هەندێك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لەسەرگەورەیی و ڕێزداری ئیمامی ( عثمان ) رضي الله عنه :

١- ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ و ئیمامی ( ابوبکر و عمر و عثمان ) رضي الله عنهم چوونە سەر چیای ( أُحُد ) ، چیای ( أُحُد ) لە خۆشیان هاتە لەرزین ، پێغەمبەر ﷺ پێی لێداو فەرمووی : ( أُسْكُنْ أُحُدُ فَلَيْسَ عَلَيْكَ إِلَّا نَبِيٌّ وَصِدِّيقٌ وَشَهِيدَانِ ) رواه البخاري ، واتە: ( ڕاوەستە ئەی ئوحود ، تەنها پێغەمبەرێك و ڕاستگۆیەك و دوو شەهیدت لەسەرە ) .

٢- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( أَلا أَسْتَحْيِي مِنْ رَجُلٍ تَسْتَحْيِي مِنْهُ الْمَلائِكَةُ ) رواه مسلم ، واتە : ( چۆن شەرم لە پیاوێك نەكەم كە فریشتەكان شەرمی لیّ دەكەن ) .

٣- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( مَنْ جَهَّزَ جَيْشَ الْعُسْرَةِ فَلَهُ الْجَنَّةُ ) ، فَجَهَّزَهُ عُثمانُ ، رواه البخاري ، واتە : ( هەركەسێك سوپای تەنگانە ( سوپای تەبووك ) ئامادە بكات بەهەشت بۆ ئەوە ، ئیمامی ( عثمان ) رضي الله عنه سوپایەكەی ئامادە كرد ) .

٤- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( مَنْ حَفَرَ بِئْرَ رُومَةَ فَلَهُ الْجَنَّةُ ) فَحَفَرَهُ عُثمانُ ، رواه البخاري ، واتە: ( هەركەسێك بیری ( رومة ) هەڵبكەنێ بەهەشت بۆ ئەوە ، ئیمامی ( عثمان ) رضي الله عنه بیری ( رومة ) ی كڕی و زیاتری هەڵكەندو كردیە خێر ) .

٥- ئیمامی ( عثمان ) رضي الله عنه لە غەزای ( تبوك ) زۆری بەخشی لە ئەسپ و وشتر، لە پاشان هات ( ١٠٠٠ ) هەزار دیناری واتە: ( هەزار میسقاڵ زێڕی ) خستە ناو كۆشی پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ ئەم دیوو ئەودیوی بە پارەكە دەكردو فەرمووی : ( مَا ضَرَّ عُثمَانَ مَا عَمِلَ بَعْدَ اليَومِ ) مَرَّتين ، رواه احمد والبيهقي والترمذي والحاكم وصححه، واتە: ( پێغەمبەر ﷺ دووجار فەرمووی : زیان لە ( عثمان ) نادا هەر كردەوەیەكی لەمەودوا بیكا ) .

## خەلیفەی چوارەم ( عَليُّ بْنُ أبي طالِبٍ )

١- ناوی ( علي ) کوڕی ( أبـي طالب ) ی قورەیشـی یە ( ١٠ ) سـاڵ پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسـلام لە شـاری مەککە لەناو ( کعبـة ) لـەدایك بـووە ، نازنـاوی ( أمير المؤمنين )ـە ، ناسـراویـە ( أبـو الحسـن ) و ( ابو التراب ) ، ناوی دایکی ( فاطمة ) ی کچی ( أسد )ە .

٢- یەکێك بـووە لە ( العشـرة المبشرة ) لەو دە کەسـەی کە هەر لە دونیادا پێغەمبەر ﷺ موژدەی بەهەشـتی پێداون و فەرموویەتی ( عَليٌّ فِي الْجَنَّةِ ) رواه الترمذي و ابـو داود بسـند صحـيح ، واتە: ( عەلی ) دەچێتە بەهەشت. هەروەها ئەصحابــەکان هەموویان یەکدەنگ بــوون لەســــەر ئەوەی کە ئیمامی عەلی رضي الله عنه لە هەموو کەس شـیاوترو لەپێشـترە بـۆ خەلیفایەتی لەدوای ئیمامی ( عثمان ) رضي الله عنه .

٣- لەهەموو غەزایەکان بەشداری کردووەو خۆڕاگر بووە ، جگە لە غــەزای ( تبــوك ) بــەفەرمانی پێغەمبــەر ﷺ لە شــاری ( مدينة ) ماوە بـــۆ سەرپەرشتی لە خاو خێزانی خۆی و پێغەمبەر ﷺ .

٤- ســـێ بـراو دوو خـوشـکی هــەبوو: ( طـالب ، عَقـيـل ، جَعْفـر )، (( فاخـتة ) أم هانيء ، جُمانة ).

٥- نــۆ خێـزانی هەبـــووە بـــە درێژایی تـەمەنی: ( فـاطمة ، خـولـة ، لـیلی، ام البنين ، أسماء ، الصهباء ، أمامة ، ام سعيد ، مُحَيّاة ) .

٦- چوارده كوڕی هەبــوو: ( الحســـن ، الحســـین ، ( محمد )ی گەورە ، عبـیدالله ، أبوبـكر ، ( العبــاس ) ـی گەورە ، عثمان ، ( جعفر ) ی گەورە ، عبدالله ، یحیـی ، عـــون ، ( عمر ) ی گـــەورە ، ( محمد ) ی ناوەنـدی ، ( محمد ) ی بچووك ) .

٧- نۆزده كچی هەبـــوو : ( ( زینب ) ـی گەورە ، ( أم كلثوم ) ـی گەورە ، رقـــیة ، أم الحســـن ، ( رملة ) ی گەورە ، أم هانئ ، میمونة ، ( زینب ) ـی بـــچووك ، ( رملة ) ی بـــچووك ، ( أم كلثوم ) ـی بـــچووك ، فاطمة ، أمامة ، خدیجة ، أم الكرام ، أم ســـلمة ، أم جعفر ، جمانة ، نفیســـة ، كچێكی تری بەمنداڵی مردووە ( ناوی نەزانراوە ) .

٨- هەندێك لە تایبەتمەندیەكانی ئیمامی ( علی ) رضي الله عنه :

أ- یەكەم كەس بوو لە منداڵان موسوڵمان بووە .

ب- لەژیانی دا ســوجدەی بۆ بــت نەبــردووە .

جـ- یەكێك لە گەورەترین ئافرەتی دونیا كە ( فاطمة ) ی كچی پێغەمبـــەرە ﷺ خێزانی بووە .

د- یەكێكە لە ( أهل البیت ) ، چونكە ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ بووە .

هـ- خۆی فیدای پێغەمبـــەر ﷺ كردووە لە شـــەوی ( هجرة ) ، لە جێگای پێغەمبەردا ﷺ نوستووە ، كە بەیەكەم گیانفیدا دادەنرێت لە ئیسلام .

و- شارەزاترین كەس بووە لە دادوەری ، پێغـــمبـەر ﷺ فەرموویەتـــی:

( اللَّهُمَّ ثَبِّتْ لِسَانَهُ، وَاهْدِ قَلْبَهُ ) رواه أحمد والحاكم وصححه ، واتە: ( خوایە زمانی دامەزراو بکەو دڵی شارەزا بکە ) ، ئیمامی عەلی فەرموویەتی: هەر دادوەریەکم کردبێ لێی دوو دڵ نەبوومە .

٩- هەندێك لە وتە بەنرخەکانی ئیمامی عەلی رضي الله عنه :

أ- هیچ سەرمایەیەك لە عەقڵ چاکتر نیە ،گەورەترین هەژاری نەفامی یە .

ب- چۆن حەز ناکەی ستەمت لێ بکرێت ، ستەمیش لەخەڵك مەکە .

جـ- بێ شەرمی سەرچاوەی هەموو خراپەیەکە .

د- هەژاری باشترە لە زەلیلی .

هـ- ئارام گرتن کلیلی شادومانی یە .

و- بەرهەمی قەناعەت ئاسوودەییە .

ز- ئامۆژگاری کردن لەناو خەڵك شکاندنەوەیە .

ح- ئامێری سەرکەوتن سینگ فراوانی یە .

ط-پاش ملە باس کردن چەکی بێ توانایە .

ی- خێرو چاکە کردن دەرمانێکی سوودبەخشە.

١٠- ماوەی فەرمانڕەوایی (٤) ساڵ و (٩) مانگ و (٣) ڕۆژ بوو، لە تەمەنی (٦٣) ساڵی دا لە (٢١) ی ڕەمەزانی ساڵی (٤٠) ی کۆچی بەدەستی پیاوێکی ( خوارج ) کە ناوی ( عبدالرحمن بن ملجم ) بوو شەهیدکرا ، لە کوفە لە ( دار الإمارة ) نێژرا .

## هەندێك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر گەورەیی و ڕێزداری ئیمامی (علی) رضي الله عنه :

١ - لەڕۆژی غەزای خەیبەر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( لَأُعْطِيَنَّ هذِهِ الرَّايَةَ غَداً رَجُلاً يَفْتَحُ اللّهُ عَلَى يَدَيْهِ ، يُحِبُّ اللّهَ وَرَسُولَهُ ، وَيُحِبُّهُ اللّهُ وَرَسُولُهُ ) رواه البخاري ومسلم ، واته: ( ئەم ئاڵایە سبەینێ دەدەمە دەست پیاوێك خوای گەورە لەسەر دەستی ئەودا خەیبەر فەتح دەكا، ئەم پیاوە خواو پێغەمبەری خۆش دەوێت و خواو پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێت ) . كە سبەینێ داهات پێغەمبەر ﷺ ئاڵایەكەی دایە دەست ئیمامی عەلی رضي الله عنه و، خەیبەر فەتح كرا .

٢ - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى؟ غَيْرَ أَنَّهُ لا نَبِيَّ بَعْدِي ) رواه البخاري و مسلم ، واته: ( ئایا ڕازی نابی پلەو پایەت لای من وەك پلەو پایەی هارون بێت لای موسى؟ بەڵام پاش من هیچ پێغەمبەرێك نیە ) .

٣ - ئیمامی ( علی ) رضي الله عنه سوێند دەخواو دەفەرموێ: ( إِنَّهُ لَعَهْدُ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ إِلَيَّ أَلاّ يُحِبَّنِي إِلاّ مُؤْمِنٌ وَلا يُبْغِضَنِي إِلاّ مُنَافِقٌ ) رواه مسلم ، واته: ( ئەمە بەڵێن و فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆ من ، تەنها بڕوادار منی خۆش دەوێت و تەنها ( منافق ) دوو ڕوو ڕقی لێم دەبێتەوە )

٤ - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( مَنْ آذَى عَلِيًّا فَقَدْ آذَانِي ) حديث

صحيح رواه أحمد وابـن حبـان والحاكم والطبراني ، واتە : ( هەر کەسێك ئازاری عەلی بدات ئەوە بەڕاستی ئازاری منی داوە ) .

٥- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( أَنتَ مِنِّي وَأَنا مِنْكَ ) رواه البخاري ، واتە : ( تۆ ( ئەی عەلی ) کەس و کارو خۆشەویستی منی ، منیش کەس و کارو خۆشەویستی تۆم ) .

**اللّهُمَّ إنّا نُشْهِدُكَ عَلى حُبِّ جَميعِ الْخُلَفاءِ الرّاشِدِينَ وسَائِرِ صَحابَةِ نَبِيِّكَ أجْمَعِينَ، وَصَلّى اللّهُ وَسَلَّمَ عَلى سَيِّدنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعِينَ .**

## کۆتایی

## سەرچاوەكان

١- ( شرح صحيح مسلم ) ، دانراوی ( الامام النووي ) ، چاپی هەژدەهەم ، (١٤٣١) ی كۆچی .

٢- ( فتح الباري شرح صحيح البخاري ) ، دانراوی ( الحافظ ابن حجر العسقلاني ) ، چاپی چوارەم (١٤٣٢) ی كۆچی .

٣- ( الصواعق المحرقة في الرد على أهل البدع والزندقة ) ، دانراوی ئیمام ( ابن حجر الهيتمي ) ، چاپی ساڵی (١٤٢٨) ی كۆچی .

٤- ( فتح المبين شرح الأربعين النووية ) ، دانراوی ئیمام ( ابن حجر الهيتمي ) ، چاپی ساڵی (١٩٧٨) ز .

٥- ( إلقام الحجر لمن زكّى سابّ ابي بكر وعمر ) ، دانراوی ( الامام الحافظ جلال الدين السيوطي ) ، چاپی یەكەم ، ساڵی (١٤٢٨) ی كۆچی .

٦- ( صَبُّ العذاب على من سَبَّ الأصحاب ) ، دانراوی ( العلامة: محمود شكري الألوسي ) ، چاپی یەكەم ، ساڵی (١٤٢٨) ی كۆچی .

٧- ( الفتح المبين في فضائل الخلفاء الراشدين ) ، دانراوی ( السيد أحمد بن زيني دحلان ) ، تحقيق: ( د. ربيع بن صادق دحلان ) ، چاپی ساڵی (١٤٢٦) ی كۆچی .

٨- ( صحاح الأحاديث فيما اتفق عليه أهل الحديث ) ، دانراوی ( الشيخ ضياء الدين المقدسي ـ الشيخ شمس الدين المقدسي ـ ابو السعادات

المقدســـي ) ، تحقـــيق: ( د. حمزة أحمد الزين ) ، چاپی یەکەم ، ســـاڵی (٢٠٠٩) ز.

٩- ( تأريخ الخلفاء ) ، دانراوی ( الامام الحافظ جلال الدين السيوطي ) .

١٠- ( الخلفاء الراشدون ) ، دانراوی ( د.مصطفى مراد ) .

١١- ( الخلفاء الراشدون ) ، دانراوی ( د.علي محمد الصلابي ) .

١٢- ( الخلفاء الراشدون ) ، دانراوی ( د. عادل علي – د. أحمد عثمان ) .

١٣- هەندێ سەرچاوەی تر .

# ناوەڕۆك

وصلّى الله على سيدنا محمد و على اله وصحبه اجمعين

بەرهەمەکان :

١- پێغەمبەری خۆت محمد ﷺ بناسە .

٢- چۆنیەتی نوێژکردن .

٣- هاوەڵان وخەلیفەکانی ڕاشیدین بناسە ﷺ .

تابەرهەمێکی تر بەخواتان دەسپێرم

